

هەژار حاتەم

# ڕێکخراوە خێرخوازییە ئیسلامییەکان;

# ژیانەوە و بوونیاتنان

## (ڕابیتەی مرۆیی و بەخشین بەنموونە)

**پێشەکی:**

**دەرکەوتنی گرووپ و ڕێکخراوە خێرخوازییە ئیسلامییەکان، کە چەند دەیەیەکە لە هەرێمی کوردستان پەیدابوون و بەهۆی ئەو ڕووبەرە ئازادییەی کە بوونی هەیە، کار و چالاکییەکانیان فراوانتربووە، هەرچەندە بێ ئاستەنگ و گرفتیش نەبوون. لەگەڵ داواکاریی و پێداویستییەکانی کۆمەڵگەی کوردیدا، ئەمانیش ئامادەبوون و ڕۆڵ و جێدەستیان بە ڕوونیی و بە قووڵیی دەبینرێت، تەنانەت متمانەی خەڵك پێیان بەشێوەیەکە، کە توانیویانە لە ماوەی هەفتەیەکدا سەدان ملیۆن دینار بۆ ئاوارە و هەژار و زیانلێکەوتووانی لافاو کۆبکەنەوە، هەروەك خۆیان دەڵێن: «متمانەی هاوڵاتیان بە ئێمە لەوەدایە، کە ئێمە جیاوازیی لە نێوان هیچ کەسێکدا ناکەین، ئەو پارەش، کە دێتە لامان بە وەقفێك لێی تێدەگەین، کە حەرامە بە لامانەوە بۆ خۆمان دەستکاری بکەین“.**

لەم بابەتە شیکارییەدا، لە بارەی دوو کاریگەرترین و دیارترین ڕێکخراوە خێرخوازییە ئیسلامییەکانەوە، کە (ڕابیتەی مرۆیی و دەزگای بەخشین)ن دەدوێن.
کار و چالاکییەکانی ئەو دوو ڕێکخراوە زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت، کە ئێمە بتوانین لێرەدا حەقی خۆیان پێ بدەین، بەڵام هەروەک وتراویشە «مشتێک نموونەی خەروارێکە».

**ئامانجەکانی ڕێکخراوە خێرخوازییە ئیسلامییەکان:**

١- ڕاستگۆبوون لەگەڵ پرەنسیپە شەرعی و مرۆییەکانی ئایینی ئیسلام، کە داوای هاوکاریی و بەدەمەوەچوونی هەژاران و بێباوکان و خاوەن پێداویستی تایبەت و ئاوارەمان لێ دەکات.

٢- پێشکەشکردنی گەورەترین و زۆرترین پرۆژەی خێرخوازیی جۆراوجۆر، بەبێ ڕەچاوکردنی لایەنی سیاسیی و باکگراوندی کەسی سوودمەند.

٣- ئاشتکردنەوەی چین و توێژی پزیشک و نەخۆش لەگەڵ یەکتریدا، چونکە نەخۆش پێیوابوو پزیشک هەر بەدوای پارەی زیاترەوەیە، بەڵام کاتێک دەبینێ، کە کەسێک بە بڕوانامەیەکی بۆردەوە دانیشتووە و بە تەنها (٣) هەزار دینار نەخۆش دەبینێت، بەوە گومانەکانی پێشووی دەڕەوێتەوە.

٤- یارمەتیدان و دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیانکردن بۆ ئاوارە و هەژار و زیانلێکەوتووانی لافاو و کارەساتە سروشتییەکانی دیکە.

٥- بوون بە بەشێک لە چارەسەری گرفت و کێشەی هاوڵاتیان دوور لە موزایەدە.

ئێستاش بە گوێرەی مێژووی دامەزراندیان، کە کامیان پێشتر دامەزرا بێت، باسیان دەکەین:

**یەکەم/ ڕێکخراوی ڕابیتەی مرۆیی (ڕێکخراوی ڕابیتەی ئیسلامیی(خێرخوازیی):**

ڕابیتەی مرۆیی ڕێکخراوێکی ئیسلامیی خێرخوازیی کۆمەڵایەتییە ناحکومییە، سەرەتا بەناوی ڕێکخراوی ڕابیتەی ئیسلامیی کورد (خێرخوازیی) لە ساڵی ١٩٨٨دا لەشاری (ئەستانبوڵ)ی تورکیا لەلایەن ژمارەیەک کەسایەتی و ڕۆشنبیری کوردەوە دامەزرا، دواتر لە ئەڵمانیا توانی مۆڵەت وەربگرێت و (پ.د. عەلی قەرەداغی)ی بووە سەرۆکی ڕابیتە، دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ و پێکهێنانی حکومەتی هەرێم و دامەزراندنی دامودەزگاکانی تر، ساڵی ١٩٩٢ ڕێکخراوەکە لەژێر ناوی «ڕێکخراوی ڕابیتەی ئیسلامیی(خێرخوازیی)» مۆڵەتی لە هەرێم وەرگرت، پاشان لە کۆنگرەی (٢٦)ی خۆی، کە لە ٢٠١٩/٨/٢٦دا لە شاری سلێمانی سازکرا، بە کۆی دەنگ ناوی ڕێکخراوەکە بوو بە: «ڕێکخراوی ڕابیتەی مرۆیی»، پاش ئەوەی لە ئەڵمانیا تۆمارکرایەوە، لە هەرێمیش لە ٢٠٢١/١/٣١دا بەو ناوە

نوێیەوە تۆمارکرایەوە (ڕێکخراوی ڕابیتەی مرۆیی).

هەروەها نووسینگەی سەرەکی ڕابیتە لە شاری سلێمانییە و لە ناوخۆ و دەرەوەش لق و نووسینگەی هەیە، کۆی ئەو پڕۆژانەی، کە تا ئێستا لە هەموو بوارەکاندا جێبەجێی کرووە، بریتی بووە لە (١٤٦٠) پڕۆژەی جۆراوجۆر، دواتر لە خشتەی ژمارە(١)دا بەوردی باسی دەکەین. ڕێکخراوی ڕابیتەی مرۆیی لە (٥) بواری سەرەکی پێکدێت، یاخود دەتوانین بڵێین بوارەکانی کاری ڕێکخراوەکە ئەمانەن:

- ئاوەدانکردنەوە - تەندروستی- فریاگوزاری- دەسەبەری - ڕاگەیاندن.

**بوارەکانی کاری ڕێکخراوی خێرخوازیی ڕابیتەی مرۆیی:**

**١- دەستەبەرکردنی دارایی بۆ منداڵانی بێباوک (نازداران):**

بەگوێرەی داتاکانی ڕابیتەی مرۆیی لە ماوەی ئەو سێ دەیە لە کار و چالاکی، ڕێکخراوەکە توانیویەتی دەستەبەری دارایی بۆ (٣١٠,٠٠٠) سێ سەد و دە هەزار نازدار بکات، واتا ساڵانە (١١٠٠٠) یانزە هەزار منداڵ.

**٢- دروستکردنی مزگەوت:**

دروستکردنی مزگەوت لە شار و شارۆچکە و ئاواییە دوورە دەستەکان، لە کارە پێشینەکانی ڕێکخراوی ڕابیتەی مرۆیی بووە. کەم گوند و ناوچە هەبوو بە منارە و دیزاینە جوانەکانی ئەم پڕۆژە ناوازەیە نەڕازابێتەوە، ئەوکات کەم کەس هەبوو بەهۆی ئابڵووقەی ئابووریی و شەڕی ناوخۆ و گرانییەوە، بیر لە دروستکردنی مزگەوت بکاتەوە، بودجەی ئەم پڕۆژەیە نادیارە، تەنانەت لە کوڕڕاسەی چالاکییەکانیشیدا، ئاماژەی بۆ نەکراوە، دوای وەرگرتنی مۆڵەت بە فەرمی لە هەرێمی کوردستان دەستبەکارەکانی دەکات، تا هەنووکە (٥٢٥) مزگەوتیان دروستکردووە.

**٣- لێدانی بیری ئیرتیوازی:**

لێدانی بیری ئیرتیوازی پڕۆژەیەکی گرنگی تر بوو، کە ڕابیتەی مرۆیی لە لادێ و شوێنەکانی دیکە ئەنجامی دەدا، بەتایبەت لەو ساڵانەی، کە شەڕی ناوخۆ بوو و نەهامەتی لە هەموو لایەکەوە تەنگی بە هاوڵاتیانی کوردستان هەڵچنی بوو، ڕێکخراوی ناوبراو توانی (٤٤٧) بیر لێبدات و ئەو ناوچانە لە تینوویێتی ڕزگار بکات.

**٤- پڕۆژەی هاوبەش لەگەڵ ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان:**

داتاکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە ڕابیتەی مرۆیی (٣٧٩) پڕۆژەی هاوبەشی لەگەڵ ژمارەیەک ڕێکخراوی نێودەوڵەتی وەک: (یونیسێف، هابیتات، ئوفد) لە شارە و گوندەکاندا ئەنجامداوە، لە پڕۆژەی ئاوی خواردنەوە، بنکەی تەندروستی و قوتابخانە.

**٥- پڕۆژەی (پەنا) بۆ دروستکردنی خانوو (شێوازی پشک، سەهم):**

پڕۆژەی (پەنا) بۆ دروستکردنی خانوو بە شێوازی پشک (سەهم)، کار و پڕۆژەیەکی نوێی ڕێکخراوی ڕابیتەی مرۆییە، کە هەر خانوویەک دابەش دەکرێت بۆ چەند پشکێک و نرخی هەر پشکێکیش بە (١٠٠,٠٠٠) سەد هەزار دینار دیاری دەکرێت.

ئەم پڕۆژەیە ئامانجی دروستکردنی خانووە بۆ هەژاران و بێلانە و نازداران و خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان، لە (٢٠١٩/١/١٥) یەکەم خانووی ئەم پڕۆژەیە لە شاری کەرکووک بە تەواوکراوی تەسلیم بە خێزانەکە کراوە، کۆتا خانووشی، کە ژمارە (٥١)ە لە (٢٠٢٢/٦/٢٢) لە شاری هەولێر دراوە بە خێزانێکی هەژار و پێی شادبوون.

**٦- پڕۆژەی نووسین و وەرگێڕانی کتێب:**

پڕۆژەی نووسین و وەرگێڕانی کتێب لەلایەن بەشی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریی ڕابیتەوە سەرپەرشتی دەکرێت و تا ئێستا زیاد لە (٢٥) بەرهەمیان بڵاوکردۆتەوە، تازەترین کاریان بە هاوبەشی لەگەڵ گۆڤاری (خاڵ) بوو لە مانگی حوزەیرانی ئەمساڵ (٢٠٢٢)دا، کە چاپکردنەوەی هەموو بەرهەمەکانی (شێخ عبدالعزیز پارەزانی) بوو، کە خۆی لە (٨) بەرگدا دەبینێتەوە.

> **دەکرێت بڵێین هەر لە بنەڕەتدا کردنەوەی نەخۆشخانەی بەخشین موجازەفە و گرەوێکی گەورەبوو، چونکە زۆر کەس پێیوابوو کە سەرکەوتوو نابن، بەڵام پێچەوانەکەی دەرچوو.**

**٧- دابینکردنی نەوت لە وەرزی زستاندا:**

پڕۆژەی دابینکردنی نەوت لە وەرزی زستاندا چەندین ساڵە ڕابیتەی مرۆیی لە شار و گوندەکاندا ئەنجامی دەدات، بەتایبەت لەو شوێنانەی کە وەرزی زستاندا زۆر سارد دەبێ.

**٨- جێبەجێکردنی پڕۆژە لە کیشوەری ئەفریقا:**

ئەمەش پڕۆژەیەکی دیکەی ڕێکخراوی ڕابیتەی مرۆییە، کە سنووری عێراق و هەرێمی بڕیووە و گەیشتووەتە کیشوەری ئەفریقا، بەتایبەت وڵاتەکانی (چاد، تۆگۆ)، کە هەژاریی و گرانبوونی نرخی شمەک تەنگی پێهەڵچنیوون، لەو ڕووەوە تا ئێستا (٣٦) پڕۆژەی جۆراوجۆر لەوێ جێبەجێ کراون.

**٩- دروستکردنی نەخۆشخانەی (میهرەبانی) لە هەولێر:**

بەگوێرەی قسەکانی (شێخ حسێن نەجمەدین قەرەداغی)، کە بەرپرسی دەستەی باڵای ڕێکخراوی ڕابیتەی مرۆییە، لە ئێستادا ڕابیتە کار بۆ تەواوکردنی نەخۆشخانەی (میهرەبانی) لە هەولێر دەکات، هەرچەندە پێشتر ڕێکخراوی ناوبراو عیادەی پزیشکی خێرخوازیی لە سلێمانی و دهۆک و چەند ناوچەیەکی دیکەی کوردستاندا هەبووە و بەشێکیان تا هەنووکەش ماون، بەڵام ئەزموونی نەخۆشخانەی (میهرەبانی) جیاوازتر دەبێ لەوانی تر.

**١٠- دروستکردنی بنکەی لەبەرکردنی قورئان:**

ڕابیتەی مرۆیی (١٢) بنکەی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز لە ساڵانی کارکردنیدا دروستکردووە.

**١١- دروستکردنی قوتابخانەی حکومی:**

پڕۆژەی دروستکردنی قوتابخانەی حکومی یەکێکی ترە لە پڕۆژەکانی ڕابیتە و لەو ڕووەشەوە (١١) قوتابخانەی دروستکردووە.

**١٢- هاوکاری نەخۆش و پیر و پەکەوتە:**

بەسەرنجدان لە داتا و کورڕاسەی چالاکییەکانی ڕابیتەی مرۆیی، شاهیدی هاوکاریی سەدان نەخۆش و پیروپەکەوتە و خاوەن پێداویستی تایبەت دەبیت، کە هاوکارییان کراوە.

**١٣- هاوکاری قوتابیانی زانکۆ و پەیمانگاکان و مامۆستایان:**

ئەم پڕۆژەیەش هاوکاریکردنی قوتابیانی زانکۆ و پەیمانگاکان و ژمارەیەک مامۆستا بووە، کە (١٣٣) کەس لێی سوودمەند بووە.

**١٤- هاوکاریی ماددیی بۆ هاوسەران:**

ئەم پڕۆژەیەش بریتی بووە لە هاوکاریی ماددیی بۆ ژمارەیەک لە هاوسەران، کە لە شاری هەولێر ئەنجامدراوە و بڕی (٧٨,٠٠٠,٠٠٠) ملیۆن دیناری بۆ تەرخانکراوە و (٣٩) کەس بە بڕی (٢) ملیۆن دینار قەرزیان پێدراوە و بۆیان کراوە بە پشک.

## خشتەی (١)

خشتەی هاوکارییەکانی ڕێکخراوی ڕابیتەی مرۆیی لە ١٩٨٨ تا کۆتایی مانگی ئایار (٥)ی ٢٠٢٢ ڕوون دەکاتەوە:

| ژمارە | جۆری هاوکاری | ژمارەی پرۆژە/ سوودمەند |
|---|---|---|
| ١ | دەستەبەرکردنی دارایی بۆ منداڵانی بێباوک (نازداران) | ٣١٠,٠٠٠ (ساڵانە ١١٠٠٠) منداڵ |
| ٢ | دروستکردنی مزگەوت | ٥٢٥ |
| ٣ | پرۆژەی ئاوی خواردنەوە (بیری ئیرتیوازی) | ٤٤٧ |
| ٤ | پرۆژەی هاوبەش لەگەڵ ڕێکخراوەکانی (یونیسێف، هابیتات، ئوفد) | ٣٧٩ |
| ٥ | پرۆژەی (پەنا) بۆ دروستکردنی خانوو بە شێوازی پشک | ٥١ |
| ٦ | دروستکردنی بنکەی لەبەرکردنی قورئان | ١٢ |
| ٧ | جێبەجێکردنی پرۆژە لە کیشوەری ئەفریقا | ٣٦ |
| ٨ | دروستکردنی قوتابخانەی حکومی | ١١ |
| ٩ | پرۆژەی نووسین و وەرگێڕانی کتێب | ٢٥ |
| ١٠ | دابینکردنی نەوت لە وەرزی ز ستاندا بۆ ماڵە هەژارەکان | |
| ١١ | دروستکردنی نەخۆشخانەی (میهرەبانی) لە شاری هەولێر | |
| ١٢ | هاوکاری قوتابیانی زانکۆ و پەیمانگاکان و مامۆستایان | ١٣٣ (تەنها هی ساڵی ٢٠١٩)یە |
| ١٣ | هاوکاریی ماددیی بۆ هاوسەران | ٣٩ (تەنها ساڵی ٢٠١٩ ئەم پرۆژەیە هەبووە). |
| ١٤ | هاوکاری نەخۆش و پیر وپەکەوتە | |




**دووەم/ دەزگای خێرخوازیی بەخشین:**

دەزگای بەخشین، دامەزراوە و ڕێکخراوێکی ئیسلامیی خێرخوازیی کۆمەڵایەتیی ناحکومی سەر بە کۆمەڵی دادگەرییە، کە لە (١٥ی حوزەیرانی ٢٠٠٩)دا دامەزراوە و ئێستا خاوەنی نەخۆشخانەیەکە لە شاری سلێمانی و (٥) کۆمەڵگەی پزیشکی دیکەیە لە شار و شارۆچکەکانی کوردستاندا. سەرەتا فیکرەی بەرنامەی بەخشین لە بەرنامەیەکی تەلەفیزیۆنییەوە بوو کە لە کەناڵی لۆکاڵی کەرکووکی (کۆمەڵی ئیسلامی)یەوە پەخش دەکرا، کە بەناوی «چاوی بەزەیی»ەوە لە ساڵی (٢٠٠٦)دا پێشکەش دەکرا، دواتر ناوی (بەخشین) جێگیربوو، تا هەنووکە بەردەوامە و لەم بوارانەی خوارەوە کار دەکات:

- دروستکردنی خانوو.
- دەسەبەری دارایی بێباوکان.
- یارمەتی نەخۆشانی درێژخایەن.
- بوونیاتنانی نەخۆشخانە خێرخوازییەکان.
- هاوکاریی ئاوارەکان.
- سەبەتەی خۆراک.

نووسینگەی سەرەکی دەزگای بەخشین لە شاری سلێمانییە و تا ئێستا بڕی (٣١,٤٣٥,٧٨١,١٥٠) ملیار دیناری لە (٢٠) بواردا خەرجکردووە و (١٣٥٦٩٩) هەزار کەس لێی سوومەندبووە، کە دواتر بە وردەکاریی تەواو لە خشتەی ژمارە(٢)دا باسی دەکەین.

هەیکەلی دەزگای خێرخوازیی بەخشین لە بەرپرسێک و چوار بەشی سەرەکی پێکدێت، کە ئەمانەن:

- بەڕێوەبردن و دارایی.
- ڕاگەیاندن.
- بەرپرسی نووسینگەکانی بەخشین لە شارەکانی تر.
- تەندروستی، نەخۆشخانەی بەخشین و کۆمەڵگە پزیشکییەکانی تر.

**بوارەکانی کاری دەزگای خێرخوازیی بەخشین:**

**١- دروستکردنی خانوو (پڕۆژەی نیشتەجێبوون):**

پڕۆژەی دروستکردنی خانوو لای دەزگای بەخشین، گرنگیەکی زۆری پێدراوە و پلەی یەکەمی وەرگرتووە، ئەوەش بەهۆی ڕێژەی زۆری کرێچێتی و هەژاریی، بەشێوەیەک، کە بڕی (٩,٥٢٨,٩٠٣,٢٥٠) ملیار دیناری بۆ خەرجکراوە و (١٨٠) خێزان لێی سوودمەندبوون.

پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە دروستکردنی خانوو لای (بەخشین) پرۆژەیەکی نیشتەجێبوونی تەواوە بە هەموو پێداویستییەکانی ژیان و گوزەران وەک (تەباخ، جلشۆر، کەوانتەر، سپلیت، کانتۆر... هتد).

**٢- مووچەی بێباوکان:**

بە گوێرەی داتاکانی دەزگای بەخشین، دابینکردنی مووچە بۆ بێباوکان لە پلەی دووەمدا دێ و بەوپێیەش لە ماوەی (١٣) ساڵ کارکردنیدا (٥,٦٩٥,٤١٤,٧٥٠) ملیار بۆ ئەم مەبەستە بەسەر (٩٤٩) کەسدا دابەشکراوە.

**٣- دامەزراندنی نەخۆشخانەی بەخشین:**

دەزگای بەخشین لەگەڵ فراوانبوونی کارە مرۆییەکانیان بیریان لە دامەزراندنی نەخۆشخانە خێرخوازییەکانیان کردەوە، بۆ ئەوەش لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی (هەواری تازە) یەکەم نەخۆشخانەیان کردەوە، هەرچەندە لە سەرەتاوە تەنها لە یەک نهۆمی بینایەکدا بوون، پزیشکی پسپۆڕ و شارەزاشیان وەک پێویست نەبوو، بەڵام ناوبانگیان هەموو کوردستانی گرتەوە، ئەویش بەهۆی (هەرزانی نرخ و پشکنین)ەکانیانەوە، کە بەڕاستی ڕەچاوی ژیان و گوزەرانی هاوڵاتیانی هەژار و کەمدەرامەتیان کردبوو.

هەروەها دەکرێت بڵێین هەر لە بنەڕەتدا کردنەوەی نەخۆشخانەی بەخشین موجازەفە و گرەوێکی گەورەبوو، چونکە زۆر کەس پێیوابوو کە سەرکەوتوو نابن، بەڵام پێچەوانەکەی دەرچوو، بەهۆی ڕاستگۆیی و دڵسۆزیی و دەستپاکییانەوە ناوبانگ و سوومعەیان تا دەهات گەورەتر دەبوو، ئەوەش یارمەتیدان، کە نۆرینگە پزیشکییەکانی تریش لە شارەکانی (هەڵەبجە، چەمچەماڵ، ڕانیە، کەلار، کفری) بکەنەوە، بەهۆی ئەوەشەوە سەدان هەلی کاریان بۆ هەردوو ڕەگەزەکە ڕەخساندووە. بودجەی کردنەوەشیان بریتی بووە لە: بڕی (٥,٤٠٦,٣٦٩,٤٠٠) ملیار دینار.

**٤- هاوکاری هەژاران و قوتابی:**

لە ماوەی کاردنیدا، بەخشین بڕی (٤,٥٥١,٨٦٦,٢٥٠) ملیار دیناری بۆ هاوکاری هەژاران و قوتابی کەم دەرامەت دابینکردووە و بەوشێوەیەش (١٨٠٥٨) کەس لێی سوودمەند بوون.

**٥- دابەشکردنی خۆراک:**

هەروەها بەخشین بۆ مەبەستی دابەشکردنی خۆراک، بڕی (١,٣٥١,٧٣٩,٠٠٠) ملیار دینار تەرخان کردووە و توانراوە بەسەر ( ٤٣٦٦٤) کەسدا دابەش بکرێت.

**٦- چارەسەری نەخۆش لە دەرەوە و ناوەوەی هەرێم:**

ئەمەش پڕۆژەیەکی گرنگی دیکەی بەخشینە، کە (٣٢) نەخۆش بۆ چارەسەر لە دەرەوە و ناوەوەی هەرێم بە بڕی (١,٠٠٨,٠٠٧,٧٥٠) ملیار دینار لێی سوودمەند بووە.

**٧- هاوکاریی بێباوکان:**

هاوکاریی بێباوکان (هەتیوان) واتا هاوکاریی ئەو کەسانەی، کە بە هەر هۆکارێک بێ باوکیان لەدەستداوە، بەبڕی (٨٣٧,٢٧١,٠٠٠) ملیۆن دینار یارمەتیدراون و (٩١٨٥) کەس سوودمەند بوون.

**٨- هاوکاریی نەخۆشی درێژخایەن:**

پڕۆژەی هاوکاریی نەخۆشی درێژخایەن بریتی بووە لە هاوکاریی هەموو کەسێک، کە چووبێتە ژێر ئەو ناونیشانەوە وەک: (شێرپەنجە، شەکرە، زەخت... هتد)، بۆ ئەوەش بڕی (٥٥٤,٨٤٠,٠٠٠) ملیۆن دینار بە سەر (٤٥٣٣) نەخۆشدا دابەشکراوە.

**٩- هاوکاریکردنی ئاوارەکان:**

ئەمەش هاوکاریکردنی ئەو ئاوارانەی گرتۆتەوە، کە لە هەرێمدا بوون، بەتایبەت ئەوانەی لە شارەکانی باشوور و ناوەڕاستی عێراق و ڕۆژئاوای کوردستان و کۆبانێ-وە هاتبوون، توانراوە بڕی (٥١٨,٦٨٠,٠٠٠) ملیۆن دیناریان بۆ کۆبکرێتەوە و بەسەر (١١١٠٤) کەسدا دابەش بکرێت.

**١٠- پڕۆژەی قوربانی:**

بەخشین بۆ پڕۆژەی قوربانی، کە ساڵانە لە جەژنی قوربانی پیرۆزدا دووبارە دەبێتەوە، (٥٠٣,٤٧٥,٧٥٠) ملیۆن دیناری تەرخانکردووە و بەهۆیەوە (٣٥٢٦٠) کەس سوودی لێوەرگرتووە.

**١١- کورسی کارەبایی بۆ خاوەن پێداویستی تایبەت:**

بێگومان کورسی کارەبایی بۆ خاوەن پێداویستی تایبەت گرنگی زۆری دەبێت، بۆیە بەخشین لێرەشدا ئەو توێژەی بیر نەچووە و بە بڕی (٣٧٦,٦٥٣,٥٠٠) ملیۆن دینار کورسی کارەبایی بۆ (٢٩٧) کەس دابینکردووە.

**١٢- هاوکاری خاوەن پێداویستی تایبەت:**

کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت لە چەند بۆنەیەکدا هاوکاریی کراون، وەک (جەژنەکان و مەراسیمی تر)، بۆ ئەوەش بە بڕی (٣١٢,١٢١,٠٠٠) ملیۆن دینار هاوکاری دراوە بە (٢٣٩٥) کەس.

**١٣- كۆمەکی زیانلێکەوتووانی لافاوەکەی شاری هەولێر:**

دوای لافاوەکەی پارێزگای هەولێر، کە لە کانوونی یەکەمی ٢٠٢١ ڕوویدا و بەهۆیەوە سەدان ماڵ زیانیان بەرکەوت، دەزگای بەخشین هەستا بە کۆکردنەوەی کۆمەک و پارە، دواتر بە بڕی (٢٦٠,٠٠٠,٠٠٠) ملیۆن دینار هاوکاری بەسەر (٤٥٠) ماڵدا دابەشکرد.

**١٤- هاوکاری ژینگەپارێزان:**

بۆ هاوکاری ژینگەپارێزان، کە مووچەیان زۆر کەمە، بەخشین بە بڕی (١٢٨,٥٠٠,٠٠٠) ملیۆن دینار هاوکاریی کردوون و بەوەش (١٢٨٥) لێی سوودمەندبووە لێی.

**١٥- دابینکردنی ماتۆڕی بار بۆ بژێویی ژیان:**

دابینکردنی ماتۆڕی بار بۆ بژێویی ژیان ڕێگەیەکی تر بووە، کە بەخشین هەوڵیداوە، ئەو توێژەش سەرچاوەی بژێوییان بۆ دابین بکرێت، بە بڕی (١١٨,٩٠٠,٠٠٠) ملیۆن دینار یارمەتی دراون و (٦٧) کەس بوونەتە خاوەنی ماتۆڕی خۆیان.

**١٦- دابەشکردنی جلوبەرگی منالآن:**

پڕۆژەی دابەشکردنی جلوبەرگی منالآن، کە (٥٨٧٧) منالّ بە بڕی (٨٠,٤٩٠,٠٠٠) ملیۆن دینار سوودمەبوون لێی پڕۆژەیەکی تری بەخشینە.

**١٧- کڕینی پێنج ئوتومبێل بۆ بژێویی ژیان:**

دەزگای بەخشین بە ئامانجی ئەوەی، کە ببنە خاوەنی سەرچاوەی ژیانی خۆیان بە بڕی (٧٠,٠٠٠,٠٠٠) ملیۆن دینار، پێنج ئۆتۆمبێلی کارکردنی بۆ چەند ماڵێک کڕی، بەڵام ئەم پڕۆژەیە ئێستا بەردەوام نییە.

**١٨- دابینکردنی نەوت لە وەرزی زستاندا:**

دەزگای بەخشین بۆ دابینکردنی نەوت لە وەرزی زستاندا، بە بڕی (٥٤,١٤٢,٠٠٠) ملیۆن دینارە نەوتی دابینکردووە و (١٨٩٧) ماڵ لێی سوودمەند بووە.

**١٩- دابەشکردنی مەکینەی دروومان و کردنەوەی خوول:**

پڕۆژەی دابەشکردنی مەکینەی دروومان و کردنەوەی خوول بە ئامانجی ئەوەیە، کە ئەو کەسانە بتوانن سەرچاوەی بژێویی ژیانیان دابین بکەن، بڕی (٥٠,٧٩٩,٥٠٠) ملیۆن دینار بۆیان تەرخانکراوە و (٤٤٧) کەس لێی بەهرەمەندبوون.

**٢٠- نۆژەنکردنەوەی قوتابخانە:**

نۆژەنکردنەوەی قوتابخانە، کۆتا پڕۆژەیە، کە دەزگای بەخشین لە ماوەی ساڵانی کارکردنیدا پێی هەستاوە، تیادا (١٩) قوتابخانە بە بڕی (٢٧,٦٠٨,٠٠٠) ملیۆن دینار نۆژەنکراتەوە.



## خشتەی (٢)

خشتەی هاوکارییەکانی دەزگای بەخشین لە ٢٠٠٩/٦/١٥ تا کۆتایی مانگی ئایاری ٢٠٢٢ ڕوون دەکاتەوە:

| ژمارە | جۆری هاوکاری | بڕی هاوکاری بە دینار | ژمارەی خێزانی سوودمەند |
|---|---|---|---|
| ١ | دروستکردنی خانوو | ٩,٥٢٨,٩٠٣,٢٥٠ | ١٨٠ |
| ٢ | مووچەی بێباوکان | ٥,٦٩٥,٤١٤,٧٥٠ | ٩٤٩ |
| ٣ | کردنەوەی نەخۆشخانەیەک و پێنج کۆمەڵگەی پزیشکی | ٥,٤٠٦,٣٦٩,٤٠٠ | |
| ٤ | هاوکاری هەژاران و قوتابی | ٤,٥٥١,٨٦٦,٢٥٠ | ١٨٠٥٨ |
| ٥ | دابەشکردنی خۆراک | ١,٣٥١,٧٣٩,٠٠٠ | ٤٣٦٦٤ |
| ٦ | چارەسەری نەخۆش لە دەرەوە و ناوەوەی هەرێم | ١,٠٠٨,٠٠٧,٧٥٠ | ٣٢١ |
| ٧ | هاوکاری بێباوکان | ٨٣٧,٢٧١,٠٠٠ | ٩١٨٥ |
| ٨ | هاوکاری نەخۆشی درێژخایەن | ٥٥٤,٨٤٠,٠٠٠ | ٤٥٣٣ |
| ٩ | هاوکاریکردنی ئاوارەکان | ٥١٨,٦٨٠,٠٠٠ | ١١١٠٤ |
| ١٠ | پرۆژەی قوربانی | ٥٠٣,٤٧٥,٧٥٠ | ٣٥٢٦٠ |
| ١١ | کورسی کارەبایی بۆ خاوەن پێداویستی تایبەت | ٣٧٦,٦٥٣,٥٠٠ | ٢٩٧ |
| ١٢ | هاوکاری خاوەن پێداویستی تایبەت | ٣١٢,١٢١,٠٠٠ | ٢٣٩٥ |
| ١٣ | کۆمەکی زیانلێکەوتووانی هەولێر | ٢٦٠,٠٠٠,٠٠٠ | ٤٥٠ |
| ١٤ | هاوکاری ژینگەپارێزان | ١٢٨,٥٠٠,٠٠٠ | ١٢٨٥ |
| ١٥ | دابینکردنی ماتۆڕی بار بۆ بژێویی ژیان | ١١٨,٩٠٠,٠٠٠ | ٦٧ |
| ١٦ | دابەشکردنی جلوبەرگی مناڵان | ٨٠,٤٩٠,٠٠٠ | ٥٨٧٧ |
| ١٧ | کڕینی پێنج ئۆتۆمبێل بۆ بژێوی ژیان | ٧٠,٠٠٠,٠٠٠ | ٥ |
| ١٨ | دابەشکردنی نەوت | ٥٤,١٤٢,٠٠٠ | ١٨٩٧ |
| ١٩ | دابەشکردنی مەکینەی دروومان و کردنەوەی خوول | ٥٠,٧٩٩,٥٠٠ | ٤٤٧ |
| ٢٠ | نۆژەنکردنەوەی قوتابخانە | ٢٧,٦٠٨,٠٠٠ | ١٩ |
| کۆی گشتی | | ٣١,٤٣٥,٧٨١,١٥٠ ملیار دینار | ١٣٥٦٩٩ هەزار کەس |

## سەرچاوەکان


بۆ نووسینی ئەم بابەتە شکارییە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:

١- دەنگێک بۆ چاکسازی و نوێگەری و چاکەکاری؛ دیرۆکی دکتۆر عەلی قەرەداغی، وەرگێڕانی بۆ کوردی: د.ئەبوبەکر پێنجوێنی، ئامادەکردنی دەزگای وەشان، چ١، سلێمانی، ٢٠٢١.

٢- منظمة بخشين الخيرية، اعداد: ڕيبوار ميراني، مطبعة بيرميرد، السليمانية، ٢٠١٨.

٣- مستشفى بخشين، اعداد: سالار ابراهيم، مطبعة بيرميرد، السليمانية، ٢٠١٧.

٤- پرۆژەی پەنا (٢٠١٩- ٢٠٢٠)، ڕابیتەی ئیسلامی کورد (خێرخوازی).

٥- الرابطة الاسلامية الكوردية، التقرير السنوى لنشاطات عام ٢٠١٩.

٦- الرابطة الاسلامية الكوردية، التقرير السنوى لنشاطات عام ٢٠١٤.

**چاوپێکەوتن:**

٧- شێخ حسێن نەجمەدین قەرەداغی، بەرپرسی دەستەی باڵای ڕابیتەی مرۆیی، سلێمانی، ٢٠٢٢/٧/٣.

٨- ڤیدیۆ: دیکیۆمێنتاری لەبارەی دەزگای بەخشین-ەوە، ئامادەکردنی بەشی ڕاگەیاندنی دەزگای بەخشین.